چەکی بایۆلۆجی: یەکێکە لە چەکە کۆکوژەکان، کە لە هەموو جیهاندا قەدەغە کراوە. چەکە کۆکوژەکان بریتین لە چەکی کیمیایی، بایۆلۆجی، ناوکی و تیشکی، یان هەر چەکێکی تر، کە ژمارەیەکی زۆر مرۆڤ بکوژێت، یاخود زیانێکی زۆریان پێ بگەیەنێت، یا زیانێکی ئەوپەڕی زۆر بەوانەی کە مرۆڤ دروستی کردوون، وەك خانووبەرە، یاخود سروشت، بگەیەنێت. چەکی بایۆلۆجی چەکێکی ئەوپەڕی کوشندەیە، لە ئێستادا کە ژمارەی دانیشتوانی سەر گۆی زەوی ٨.٧ ملیار کەسە، ١١٤. ١گرام (گرامێك و سەد و چواردە میللیگرام) لە تۆکسینی بۆتولینۆمی خاوێن، بەشی ئەوە دەکات هەموو دانیشتوانی سەر گۆی زەوی بکوژێت. ئەم چەکە ترسناکە. نەوەك دەوڵەتان، بەڵکو گرووپە تیرۆریستییەکانیش دەتوانن بڕێکی زۆر لێ دروست بکەن و بەکاری بهێنن، چونکە تێچوونی دروستکردنەکەی، لەچاو تێچوونی دروستکردنی چەکە کیمیایی و ناوکییەکان، زۆر کەمترە.




